شیعر

# ئاهی دڵێکی بریندار

ئاراس کاژاوی

2008


پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ئاهی دڵێکی بریندار

نووسینی: ئاراس کاژاوی

بابەت: هۆنراوە

تایپ: ئامانج عارف

هەڵەبڕی: ئاراس

بەرگ و دیزاین: حیکمەت مەعروف

تیراژ: 1000

چاپخانە: کەمال

ژمارەی سپاردن: (33) ساڵی 2008

پێشکەشە:

## بەو کەسانەی رێز لە هۆنراوە دەگرن





**پێشەکی:**

**هۆنراوە شتێك نییە تا ئەمڕۆش پێناسەیەکی هەبێ، بەڵکو تەواوی لێکۆڵینەوەکان یان رەخنەگران نەیانتوانی پێناسەیەکی ستاندار بۆ هۆنراوە و شاعیر دابنێن، دیارە هەلومەرج و بارودۆخ راستەوخۆ کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان هەیە بۆیە منیش هەمان کاریگەری لە دەروونمدا دروست بووە بۆ هاتنەناو دنیای هۆنراوە، ئاواتێکی پڕ لە رەنگ و حەزێکی یەکجار جوان و بێ وێنەم هەبوو تا خوناوکە ئیلهامییەکان ببنە هۆنراوە من هەرزوو هەستم بەوە کردبوو کە ئەو وێنانەی لە ئیلهامی مندا هەیە، دەیانەوێت خۆیان لە هۆنراوەدا بەرجەستە بکەن. سەرەتای هەموو خوناوکە ئیلهامێکم بۆ ئەو مرۆڤانەیە کە خۆشەویستییان خۆشدەوێ و رقیان لە دابڕانە، پێشموایە هەر کۆمەڵگە و نەتەوەیەك بە راستی خۆشەویستی خۆشدەوێت و خۆشەویستی نەبێتە پەیامێکی پەروەردەیی ئەوا مرۆڤەکانی لێوان لێون لە**

**تاوان و غەدر. من ئەو دەنگانە دەهێنمەدەر کە رۆژانێك دیلی دەستی کۆمەڵگەیەکی رقاوی بوون، نیگای ئەو چاوانە دەدوێنم کە رۆژانێك نیگاکردنیان لێ حەرامە. من دەمەوێت نۆتەی قوڵایی ئازاری دڵەکان بە ئێوە ئاشنا بکەم، پێتانبڵێم کە نەتەوەکەی من هێشتا خەم و دابڕان بەسەر روخساری مرۆڤەکانییەوە دیارە، من نەهاتووم رەشبینی بە ئێوە ئاشنا بکەم، بەڵکو وەك وێنەگرێك رەشبینی مرۆڤی نێو کۆمەڵگەکەی خۆمم بە ئێوە ئاشنا کرد. مافی خۆشمە ئەگەر بڵێم کە درۆم لەگەڵ ناخی خۆم نەکردووە، کەم تا زۆر هۆنراوەکانم بۆ کەسێکم نووسیوە کە دڵم کردۆتە نیشتیمانێك بۆ خۆشەویستی ئەو و ئێمە شانۆکاری عەشقی پاکی مرۆڤەکان بین، ئەرکی منیش ئەوەیە پێتانبڵێم لە کوێدا خۆشەویستی هەیە، ژیانیش هەیە، لە کوێشدا دابڕان هەیە مەرگ نزیك ترە لە ترس. لەگەڵ ئەوپەڕی ژیانێکی پڕ خۆشەویستی بۆ تەواوی مرۆڤەکانی دنیا.**

ئاراس کاژاوی
07701559019





## کەلەپچەی ئەشق

**هەر ئەو ساتەی کە تۆم ناسی**
**هەستم دەکرد کە خۆم ون کرد**
**خەندەی لێوم بە تۆ بەخشی**
**بۆ فرمێسکت لەسەر رۆ کرد**
**رێگەی سەخت و دوورم بڕی**
**بۆ گەیشتن بە ئەشقی تۆ**
**کەچی ئێستا لە ژێر باڵی خیانەتدا**
**پێمدەڵێی گیانە خەم مەخۆ**
**ئاواتەخوازم بە مەرگ**
**کە ناتوانم دەستبەرداری ئەم ئەشقە بم**
**لە نێوان خەون و تاوانا راوەستاوم**
**وەختە بە تەواوی شێت بم**

***

## بڕوام نەبوو

بڕوام نەبوو کە ئەشقی تۆ
سنوری دڵ ببەزێنێ
خۆشەویستی و نیگاکانت
هەرەس بە کۆشکی دڵ بێنێ
من بە چەشنێ تۆم خۆشدەوێ
کە گشت کاتێک یادت دەکەم
زۆر شەوان تا سپێدە
بەس ئەوینت پێناس دەکەم
سەیرە دڵم ئا بەم چەشنە
مۆمی ئەشقی داگیرساوە
هێندە فرمێسکی گڕاوی
لە چواردەوریا راوەستاوە
****





## بارانی ئەشق

خۆشەویستیت وایلێ کردووم
لەگەڵ بارانا شەڕ بکەم
لە بری ئاو، خاکی ئەشق
بە فرمێسکی چاو تەڕ بکەم
کەچی دڵی تۆ ناتوانێ
خۆزگەی ئەشق هەڵبڕێژێ
بەو بارانەی من دایدەکەم
نەمامی عومری بنێژێ
***

## دیاری جەژنی قوربان

سبەی جەژنە و ئاخر گوڵم
لەگەڵ کێ شادی بگێڕم
سبەی جەژنە و هیچ شک نابەم
تا بە دیاری بۆت بنێرم
ناتوانم دڵمت پێشکەش کەم
چونکە پڕ پڕە لە زوخاو
رۆحیشم نەک پێت نامۆ بێ و
بتوێتەوە لەبەر هەتاو
بەس پارچە شعرێک شک دەبەم
روخساری هەستم بنوێنێ
کاتێ کە دەیخوێنێتەوە
شادی لە ناختا بخولقێنێ





ئەگەر ئەوەت قبوڵ نەبوو
جەستەم دەکەم بە قوربانی
نییەتی ئەوەی لێ دەهێنم
کە بژی بە کامەرانی

***

## فەنابوون

چرکە بە چرکەی تەمەنم
ئاوابوونە لە خەونێکا
بەرلەوەی بێمە دیدارت
فرمێسک لە چاوم دەتکا
کاتێ هاتم بە خەندەوە
بۆ تۆ دەدوام ....
هەر ئەو ساتەی بەجێتهێشتم
بۆ گەڕانەوەت دەگریام
***





## خۆری نیگات

تۆ کە خۆری خۆشەویستیت
ئەوەندە پەرش و بڵاوە ..
تیشکەکانی خۆزگەی ئەشق
سەد ئاشقی تێئاڵاوە
ئیتر تیشکی خۆری نیگات
مەگرە کانگەی دڵی هیچ کەس
تۆ کەسێکی قەت ناتوانی
دڵی کەسێ بکەی بە کەس
***

## ڕەنگی پایز

لەو ساتەوەی کە هاتوومەتە دیدارت
ڕەنگی پایزم خۆشدەوێت
کە تۆ گوڵی چوار وەرزە بیت
بەهاریش جوانی تۆی دەوێت
لێوان لێوم لە ئەشقی تۆ
چونکە دڵم هەموو کاتێ بیرت دەکا
جوانی بەهارم بۆ چییە
کە چاوم وێنەت دروستکا

***





## ئاهی دڵێکی بریندار

بەرلەوەی پایز بمگاتێ و
وەرزی گەڵاڕێزان ببینم
بەرلەوەی باڵندە کۆچکا و
خۆری ئێوارە بڕوێنم
نیشتمانێکی ئەشقی سەوز
خەندەی بە لێومان دەبەخشێ
نهێنی جێژوانەکانمان
درەختەکان بوو دەیپۆشێ
لەو ساتەوەی کۆچت کردووە
بەرگی خەفەتە دەیپۆشم
بۆیە هەردەم ئەشقی بادە و
پێک لەسەر پێک مەی دەنۆشم

ئاهی دڵەی بریندارم

شەراب نەبێ چاری نییە

خوڕەی فرمێسکی چاوانم

وەک ئاوی چەم و کانییە

***





## ژینێکی پڕ لە ژان

لە نێو سینەی گریانەوە ئازارم لە دایک دەبێ

لە چاوی فرمێسکەکاندا حەزەکانمی تیا ون دەبێ

پەڕوباڵی خەونەکانم مۆمی عومرم دەیسوتێنێ

بزە و خەندەی سەرلێوانم چاوەڕوانی دەیتۆرێنێ

وتەکانت مەلی شادیم لە نێو خەما دەخنکێنێ

ئەم تەنیایی و بێزاریە رۆح لە نێو جەستەم دەردێنێ

***

## رووت لە مانگدا درەوشاوەیە

لە مانگدا روخسارت دەبینم بۆیە ئەمشەو ئێشکگرم
تا رووی مانگم لێوە دیار بێ من هەر دەستی شیعر دەگرم
( تاکە هاورێم پێنووسێکە بۆ نووسینی شیعرەکانم )
سینەی پڕ لە وشەی جوانە بۆ هەنسکی خامەکانم
ئیتر هەتاکو بەیانی هۆن هۆن شیعر دەهۆنمەوە
هێشتا ناگات بەو روخسارەی کە لە مانگدا دەیبینمەوە
گەر بەیانی خۆر هەڵهات و رووی مانگم لێ تەوەلا بێ
لە پرشنگی قژی خۆرا بەدیت دەکەم رووت وەکو مانگ لێم ون نابێ
***





## ئەشق

ئەشق نیشتمانی منە
ئەشق دەریایە و بێ بنە
ئەشق تاجی سەری منە
ئەوە ئەشقە لە من ونە
ئەشق سەرمایەی ژیانە
ئەشق شەوی چراخانە
ئەشق گوڵی چوار وەرزەیە
هەروەک دایکم نازی هەیە
تەنها ئەشق لە لای ئاشق نرخی هەیە
ئەشق گەورەترین شەهادەیە
ئەشق لە دایکبوونی گەورەیە

کێ وەک ئێمە ئەشقی هەیە
ئەشق دەروازەی خۆی هەیە
ئەشق ولاتێکی بێ ئۆخەیە
ئەشق لوتکەی لە هەورایە
ئەوەئەشقە چۆک دانایە
***





## بێ بەڵێنی

ئێستا وادەی بەسەرچووە ئەو بەڵێنەی کە تۆ پێتدام
تۆ درۆت کرد، ئەی بێ وەفا وەکو مەسیح لە خاچت دام
ئێستاش دەڵێی چاوەڕوان بە خۆ دڵم مۆمیا نەکراوە
خۆ لە ڕێگەی ئەشقی تۆدا ڕۆحم زیندانی نەکراوە
بێ بەڵێن و بێ وەفا بوویت، ئاخر کێ بوو بە مامۆستات
ئاخر سێبەری چی داری بۆ خۆت دەکەیت بە مەنزڵگات
ڕەنگە ئێستا ئاسان بێ لات کە دڵت بەش بەش کراوە
کە دڵت کردووە بە باخێکی بێ خاوەن و پەرژینیشی بۆ نەکراوە
وا دەزانی ئەم ڕێگایە ئاواتت بۆ دەڕەخسێنێ
ئەی نازانی تیا ون دەبی و دەست و قاچت دەشکێنێ
***

## خۆزگەی فەنابوون

خۆزگە وەکو تاریکی شەو هەرگیز رۆژم نەناسیایە
بە وێنەی شەمشەمەکوێرە لە رۆژا چاوم کوێر بووایە
خۆزگە لە بیبانێکدا دەبووم بەس تۆز و خۆڵم بناسیایە
بۆ قومێک ئاو، پێکێک شەراب هەتا مەرگ رامکردایە
خۆزگە هەموو تەمەنم لە ئەشکەوتا بردایەسەر
هیچ کەسێکم نەناسیایە تاکو دوور بم لە دەردیسەر
خۆزگە وەکو شەهیدەکان ئێستا جێم گۆڕستان بووایە
یاخود ئاشق بە چاوی تۆ و شەقامەکە نەبوومایە
خۆزگە هەر لە ئەزەڵەوە هەردوو چاوانم کوێر بووایە
تا روخسارت لە چاوانما نەخشەی ئەشقی نەکێشایە

***





## دیمەنێکی خەیاڵییە

سەما ئەکا پێنووسەکەم لەسەر پەڕەی سپی دڵت
پێدەکەنێ قەڵەم لێوی سوراوەکەت لەسەر لێوی وشک و سڕت
بەجێماوە پەنجەکانم لە تێو قژی رەش و پڕت
خۆی دەنوێنێ شیعرەکانم لە باوەشی گەرم و گوڕت
گریانیشم هەنسک دەدا لە نێو سینەی پڕ لە گڕت

***

## بەیانی

نیگات وای لێکردووم
کە بەو ئەشقەوە پەیوەست بم
سپێدە پێش هاتنی خۆر
بە ئاگا بێ دڵ و هەستم
دەڕۆم بۆ سەرئەو شەقامەی
کە تۆ تیایا گوزەر دەکەی
دەڵێم بەڵکو بە نیگایەک
بەیانی باشم لێ بکەیت
بێ مروەت بووی گوزەرت کرد
نیگایەکت تێ نەگرتم
هاتم ئاشنام کەیت بە دڵت
تۆ لە ئامێزت نەگرتم

***





## لێوەکانم

ئەو شەقامەی لەگەڵ تۆدا پیای دەڕۆیشتین ئا لەم شارە
گوڵم ئێستا چۆڵ و هۆڵە بێ تۆیان پێوە دیارە
ماوەیەکە شەقامەکە بۆنی گەڕانەوەی لێ دێ
هەر کەسێک ناوت دێنێ حەز دەکا زیاتر لێی بدوێ
درەختەکان بە خەندەوە داوا دەکەن بیاندوێنین
چاوەڕوانن کە بێیتەوە گەڵای شادی هەڵوەرێنن
کەی دێیتەوە لێوەکانم بەبێ خەندە دەجوڵێنم
کەی دێیتەوە هەتا تاسەی دڵەی تەنیام بشکێنم

***

## قەدەر

له بیرکه ئەو رۆژانەی
قەدەر تۆی ون کرد له دەستم
خۆ تۆ ئێستا بەشێکی لێم
لەگەڵ دڵ و رۆح و هەستم

ئەو رۆژانەم له یاد ناچن
که تۆ گوڵ بووی به دەستمەوه
بڕوا بکه خۆشمدەوێت
ئێستاش له ناخ و هەستمەوه

گیانه سوێند بێ به وشانەی
یەکەم ژووان درکانم بۆت
ئەگەر چاوانم داوا بکەیت
دڵیشم دەردەهێنم بۆت

***



ئاراس کاژاوی
ئاهی دڵێکی بریندار

## سۆز

دەبڕوانه چاوەکانم
هێنده ئەشکی بۆت رشتووه
دەریایەکی له ئەوینی
چاوەڕوانی دروست کردووه ...

له دوای کۆچت پەڕەی شیعریش
تەمی خەمی لێ نیشتووه
من تێ ناگەم ئەم کۆچەی تۆ!
بۆ کام هەوارت بردووه؟

بۆ شەماڵی سۆز هەڵناکەی؟
دەریای عیشقم بهەژێنی؟
فرمێسکی سەر پەڕەی گوڵی
دڵی تەنیام بوەرێنی

***

## سەفەر ناکەم

بۆ بەهەشتیش سەفەر ناکەم
گەر چاوت ون بێ لە چاوم
هەتا دەستت دەستم نەگرێ
بۆ سەفەر ناجێ هەنگاوم

گەرووم تینوی هەناسەتە
پێم رێ ناکات لەبەر ئەشقت
نەکەیت گیانە بەجێمبێڵی
بمخنکێنێ بادەی ئەشکت
***





## ماچ

گوڵم ماچی لێوەکانت
شفایە بۆ دڵەی زامدارم
کە پێتدەڵێم بۆ ماچێ
دەڵێیت لە ئەشقت بێزارم

کە تۆ لێوت هێندە ئاڵە
شیلەی هەنگی لێ دەچۆڕێ
بۆیە حەز دەکەم ماچت بکەم
نەبا دڵت لێم بگۆڕێ

چەندە خۆشە تاسەی لێوم
بە ماچی لێوت بشکێنم
گوڵی هیوای خۆشەویستی
لە نێو دڵمدا بڕوێنم
***

## ئەشقێکی ون

به دەم ئەشقێکی ونەوە
تەمەنێک چاوەڕێم کردی
تۆ خەزانی کام پایز بوو
وەرینی گوڵی فێر کردی

هەر چەند دوور بی نزیکم لێت
وەک سێبەری سەر ڕێگەکەت
بۆ ساتێکیش نایتۆرێنم
بزەی سەرلێوە ئاڵەکەت

له چاوانما روخساری تۆ
وەک پەپولەی نیشتە گوڵە
زەردەخەنەی لێوەکانت
جۆش و خرۆشی نێو دڵە





تەمەنێکە چاوەڕوانم
دڵی خۆمت پێ ئاشناکەم
لە نێو نیگای چاوی تۆدا
شۆڕشی عیشق بەرپاکەم

***

## دڵم داوات دەکات

لەو ڕۆژەوەی بەجێتهێشتوم
گۆچانی خەم دەستی گرتووم
دەمەوێت بێمە دیدارت
هەنگاو نانێت جەستەی مردووم
کاتێک کە دیم شەقامەکان
ڕێگە بە هەنگاوم دەگرن
قاچەکانم وشک دەبن
ناتوانن جەستەم هەڵبگرن
هیچ ئاشقێ وەک دڵی من
خەم لە ناخی نەچۆڕاوە
هێندە تامەزرۆی دیدارتم
ڕێی ژوانتم لێ گۆڕاوە





زمان لاڵ و بێ توانا بێ و
سکاڵا و ئاهم پێت نەگات
گەر دەست و قاچیشم ببڕن
دڵم هەر داوای تۆ دەکات
***

## هەموو کاتیّ تۆ لە دڵمای

چی بنووسم تا بزانی
ئاشقم بە ئەشقی دوو چاوت
یاخود دڵم ئاشق بووە
بە پەرچەم و قژی خاوت

دوور لە سۆزی ئەو چاوانەت
گشت کاتێکم ئەندێشەیە
ئەوەی ئێستاش یادی دەکەم
هەر ئازاری ئەو ئێشەیە

ئێستا رۆژانی تەمەنم
بە ریّ دەکەم بە تەنهایی
بەرەو سنوورێک دەڕوانم
لێیان کردووە ماڵئاوایی

***





## تۆ روناکیت

بۆچی نایەیت وەک خۆرهەتاو
ئاسمانی دلّ رۆشن بکەی؟
ئەستێرەکان لە تاریکی
ئەمشەوگارە رزگار بکەی
گوڵم لە کوێی بۆ ناپرسی
لە تاریکبوونی تەمەنم
گوڵم لە کوێی بۆ ناپرسی
لە گەڕانەوەی زەمەنم
لە نیشتیمانی چ ئاشقیّ
بارگەی ئەوینت هەڵداوە
تیشکەکانت لە باوەشی
کام ئاشقدا بەجێماوە؟

ئێستا روناکی تۆم دەوێت
کە لێم تاریک بووە ژینم
با رۆژانی خۆشەویستیت
هەر لە ئاسماندا ببینم

***





## ئێوارە

ئێوارەیەو دڵەی شێتم
بادەی خەفەتی نۆشیوە
سەرتاپای گشت یادەکانی
بە بەرگی رەش داپۆشیوە

دڵشکاوم وەک شووشەی
بەجێماوی مەیخانەی خەم
چونکە هاتی کە روانیت لێم
دەستت گیر نەکرد لە یەخەم

شکا شووشەی ئاوێنەی دڵ
کاتێ تیری نیگات بۆ نارد
کەچی رۆشتی بەجێتهێشتو
بە تەنیایی و خەمت سپارد

***

## خۆشمدەوێیت

خۆشەویستی ناو دڵی من
بەس بۆ تۆیە هەناسەکەم
بۆیە عەشقت لەناو دڵما
بەم جۆرە پێناسە دەکەم ...
دەتۆش وشەی خۆشمدەوێیت
بدرکێنە بە لێوانت
هەتا منیش ببمە قوربان
دڵ و رۆح و هەست و گیانت
***





## دواین دیدار

لە دوای کۆچم مۆمێکی نوێ
لە ژورەکەت داگیرسێنە
پەڕە پەڕەی شیعرەکانم
بە دیارییەوە بسوتێنە
نەک هەنسکی دێڕێ شیعرم
فرمێسک بە چاوت داکا
با لەگەڵ کۆچی ناوەختا
ئەویش ماڵئاوایت لێکا
***

## تۆ هەر گوڵی

تۆ ئاوێتەی گوڵاوێکی
گوڵپرژێنی باخی گوڵی
تۆ شاباڵی مەلی سۆزی
موحیبەتی شاری دڵی
تۆ خونچەی تازە گوڵێکی
شێواوی دەستی خەزانی
تۆ ناسکی بە  وێنەی گوڵ
هەر وەکو پەپولە جوانی

***





## گوڵ

گوڵم بۆچی خۆشتدەوێم کە دەزلنی ئەمن شێتم
تۆ شیرینی لە ناو دڵما بۆیە منیش خاکی رێتم
لاشەم چەتری بەربارانێکی باخچەیەکی بێ هەتاوە
دڵم گوڵی بەهارێکە خۆر لە چاویا نەبینراوە
لێم مەپرسە بۆچی دەستم زوو زوو گوڵت بۆ دەهێنێ
خۆشەویستی گوڵێ نییە تا پایز هەڵیوەرێنێ
بەهار هێندە بە تاسەوە عەشقی تۆی خستۆتە دڵم
هەر چوار وەرزی ساڵ پایز بێ هەر گوڵت بۆ دێنم گوڵم

***

## سالآنێکه

سالآنێکه خۆشمدەوێیت
تەمەنێکه چاوەڕێتم
گوڵم هێندە ناوت دەبەم
خەڵکی وا دەزانن شێتم
نازانن منیش عاشقم
بە وێنەی فەرهاد و مەجنون
عەشقت گەورەیە لە دڵما
بە قەد بالآی کێوی بێستون
بۆیە هەر کاتێک نەتبیم
وا هەست دەکەم ژین خەیاڵە
لەبەر ئەوەی خۆشەویستیت
بەسەر دڵ و رۆحما زاڵە
***





## پێنەزان بووی

پێنەزان بووی لە عەشقی من
بۆیە دڵت لێتۆرانم
چاوەڕێ بووم وەکو بەهار
سەوزی کەی گەڵای ژیانم
درەختێ بیت وەک سنۆبەر
هەمیشە سەوز بێ بالآت
دڵم بکەی بە نیشتمان
عەشقیشم بکەی بە ئالآت
***

## دۆزەخ

باوەشی تۆ دۆزەخێکە
جەستەی منی تیا سوتاوە
حەزەکانم وەک خۆڵەمێش
لە ئامێزتا بەجێماوە
من ئاواتەخوازی ئەوەم
کە تێر لە باوەشت بگرم
هەر چەندە جەستەم دەسووتێ
کەچی بە دڵ هەر نامرم
چونکە دڵم خۆی ئاگرە و
گڕی عەشقی تیا دەگڕێ
بۆیە وا بەرگەی سووتانم
ئازاری عەشقی تۆ دەگرێ
***





## تارای سپی

بۆ کێ تارای سپیت پۆشی
پێکی هاوسەریت پێنۆشی
شەو تا بەیان لە باوەشی
کام بەختەوەردا سەرخۆشی
چۆن عەشقمت فەرامۆش کرد
کە لە خۆما بۆت دەگەڕام
ئەو رۆژانەت لە بیرچۆوە
کە دەتوت من بێ تۆ تەنیام
برۆ چیتر پیرۆزت بێ
لەو سەفەرەی بێ ئاگابووم
ئەوە خەون و وەفای تۆ بوو
وامدەزانی هەر من لە چارەنووستا بووم
***

## تۆ لە دڵمای

لە تانگۆی دڵما یەکەمی

بە خەندەوە پێدەکەنی

کە بە نەرمی سەما دەکەی

وەک فریشتە دەردەکەوی

لە ئەلبومی دڵی مندا

بەس وێنەی تۆ بەدی دەکرێ

ئەوەندە وێنەی تۆی تیایە

هیچ وێنەیەکی تر ناگرێ

دەبێ هەر بە وێنەی فاتکوخ

ببمە رەسام ئا لەم شارە





تا لە چاوی پێنووسمەوە

هەست بکەم روخسات دیارە

ئەوسا دەست و پەنجەکانم

لەگەڵ پێنووسە دارەکەم

با هەر روخسارت دروستکەن

ئەی نازدارە عەیارەکەم

***

## ئەمشەو

ئەمشەو ژیان لە نامۆی و
دابڕاندا خۆی ون دەکا
حەسرەتی خەم بەرێوەیە
بە چرپەوە بانگم دەکا ...
ئەمشەو حەزە رەنگاڵەکان
لەبەر چاوم رەش و روتن
گریام بۆ ئەو فرمێسکانەش
کە بۆ عەشقی من رشتوتن ...
ئەمشەو شەستە و رهێلەیە
هەورەگرمە و رەشەبایە
دەرختی کۆڵانەکەشتان
هەر وەکو من خەوی نایە ...





ئەمشەو خامەی دەستم ماندوبوونە
وا لە تاوا هەڵدەوەرێ
مەرگ رێبواری ماندووە
بەرەو لای من رێگە دەبڕێ ...
ئەمشەو قەدەر بە کۆڵانی
یادەکانما پیاسە دەکا
چارەنووسی ئەم ئەوینەم
لە تارمایی شەوەزەنگا دیاری دەکا
***

## ئاسوودە بوون

ئێستا دڵم وەک ساوایەک
پڕ پڕە لە بەختەوەری
ئەو ئازارە ..
بەجێیهێشتم
کە بۆ چاوەڕوانی
دەگری ..
هەرچی خۆزگە و خەونی ساڵە
چی ئەندێشە و چی خەیاڵە
بوونە راستی ...
بەو نامەیەی کە تۆ ناردت
بەو فرمێسکەی لە چاوانم تۆ تۆراندت
کە نووسیبوت ..
چاوەڕوانی زەنگت دەکەم
ئاواتی دڵم بوو گوڵێ
نوقمی دەریای ئەوینت کەم





کە پێمووتی هێندەی دونیا
تۆم خۆشەوێ
بێ عەشقی تۆ
دڵم بۆ ساتێ ناسرەوێ
زۆر سەسام بووی ...
چونکە دڵت بۆ ئەوینی
کە سێکی تر ئەویندارە
راستییەکەییت لای من نەوت
حەزت نەکرد ...
دڵم بدەی لە سێدارە
حەزت نەکرد ...
چرۆی عومرم
بە دەستی خەم هەڵوەرێنێ
حەزت نەکرد ...
هیواکانم
لە سینەمدا بخنکێنی

***

## خەمی دووریت

خەمی دووریت هێندە سەختە
پەپولەی شادی خنکانم
بڕواناکەم هیچ شک بەرم
جگە عشقت کاریگەر بێ بۆ ژیانم
مەگەر مەرگ رێم پێ بگرێ و
عەشقت لە ناو دڵما دەرکا
عەشقت قیبلەی یادەکانمە و
هەست و سۆزم رووی تێ دەکا
شەو تا بەیان هەراسانم
چونکە دڵم داوات دەکا
بەڵام گیانە زۆر دەترسم
دڵی تۆ لە رازم نەگا
***





## زەردە پەڕ

ئێوارەیە و ئاگام لێیە تیشکی هەتاو
بە هێمنی ماڵئاوایی لە شار دەکا
ئێوارەیە و ئاگام لێیە زەردەپەڕیش
بە تابلۆیەک ئێوارە باشمان لێ دەکا
ئێوارەیە و ئیدی تاریکی و بێدەنگی
باڵ بەسەر شاردا دەکێشێ
ئێوارەیە و هەرچی خەمی ئەم دونیایە
بۆ دڵەی مات و زەلیلم دێتە پێشێ
***

## لێم ببورە

لێم ببورە کە نەمتوانی خۆشەویستیم ئاشکرا کەم
لە سنووری ئەم عەشقەدا بە دڵی خۆمت ئاشنا کەم
لێم ببورە کە نەمتوانی بە شەو رۆژ لە بیرتابم
بە ئەوینێکی پاکەوە تا دوا چرکەساتی تەمەن لەگەڵتابم
لێم ببورە کە نەمتوانی لە باخێکدا گەورەت بکەم
چواردەورت هەمووی گوڵزار بێ و بە پەپولەت ئاشنا بکەم
لێم ببورە کە نەمتوانی ئاسمانێک بم بۆ هەڵگری خەمەکان
بۆنەیەک بم بۆ بەخـــتەوەری ژیانـــت...
لێم ببورە کە نەمتوانی هاوبەشت بم بۆ ئازار و پەژارە و خەم
لە باخی پڕ خۆشەویستی و لە پەرەی گوڵ جێت بۆ راخەم
***





## عەشقت

عەشقت ئەگەر مانگ و خۆرە
من ئەستێرەی دەوری ئەوم
عەشقت ئەگەر مامۆستایە
من خوێندکاری وانەی ئەوم!
عەشقت ئەگەر باخچەیەکە
گوڵپرژێنی گوڵی منم
عەشقت گەر بێت و کەشتی بێ
من دەریایەکی بێ بنم ..!
عەشقت ئەگەر شەوگارێکە
من دەبمە خەوی قوڵی
عەشقت ئەگەر نەمامێکە
ئامادەم بۆ خاک و خۆڵی ..!
عەشقت ئەگەر گەوهەر بوایە
یەکەم کڕیاری من دەبووم

عەشقت ئەگەر باڵدار بوایە

لە ئاسمان چاوەڕێت دەبووم ..!

خۆ عەشقت ئەگەر ئاگر بێ

وەکو مۆم بمتوێنەوە ..!

ئەی ئەگەر عەشقت عاشقمە

ئاورێکم لێ بەرەوە ..!

***





## بۆ نارِوانی

کاتێک کە دێم بۆ بینینت

گشت گیانم لە خۆشیدیە

تا ئەو ساتەی تۆ دەبینم

خورپەیەک بە دڵما نایە ...

بەڵام کە دێیت لێم نارِوانی

گشت شتێ گومانی تیایە!

رەنگە هەست نەکەی کە عەشقت

وەک سێبەرم لەگەڵمایە ..!

یاخود رۆژێ تۆ نەبینم

بینایم کوێرە و هەڵنایە

یان عەشقی کەسێکی تر

لەگەڵ چارەنوست دایە ...

یاخود لەبەر قسەی خەڵکی

چاوت بە روومدا هەڵنایە

رەنگە کێشەیەکت هەبێ و
بێزار بووبی لەم دونیایە ...
یان نەزانی شەو تا بەیان
لە بەر عەشقت خەوم نایە
ئەوسا دڵم وەک نووستبێ
بە ئازارێک بە ئاگایە ...!
***





## کاڵبوونەوە

رەنگە دواین دیدارمان بێ
ئیتر بڕۆم و جێتبێڵم
خۆش ئاسوودە و بێ خەم بژی
ئەی خۆشەویستی چەند ساڵەم ..
ئەڕۆم هەتا یادگارییەکان
لە دیدەما کاڵ ببنەوە
ئەو شوێنانەی جێ ژووانمان بوو
جارێکی تر نەیبینمەوە ...
خۆ دەزانم دوای سەفەرم
نمەیەک ئەشک رۆناکەی
عەشقمت لا فەرامۆش دەبێ و
بۆ ساتێکیش یادم ناکەی
***

## زیـــــزبوون

چەند زیز دەبم لەو شەقامە
ئەگەر رۆژێ تۆ نەبینێ
ئەگەر رۆژێ هەنگاوی تۆ
لە روخساریا جێ نەمێنێ ..
بێ وەفایم وام لێ ناکات
ئەو وشەیە بدرکێنم
لەبەر خاتری تۆیە گوڵم
ئەو شەقامەش دەدووێنم

***





## شەوی مەرگ

سەیرە ئەمشەو نە بارانە و
نە هەورەگرمە و برووسکە
نە بارینی بەفری شادی و
نە تەرزەی رق و قەتیسمە ..
کەچی هەورێکی رەشی چڵکن
رووی ئاسمانی داپۆشیوە
ماوەیەکە نە لە شەقام
نە لە مانگدا روخساری جوانتم نەدیوە

***

## کـۆچ

تویشوی سەفەرم هەڵگرتووە
رەنگە ئیتر نەتبینمەوە
دەڕۆم تا دوور لە عەشقی تۆ
ونبوونی خۆم بدۆزمەوە ..!
چۆن لێرە ژیان بەسەر ببەم
کە جێژوانەکان جێی یادگاری من و تۆیە
چرۆی هیوام نەبوو بە گوڵ
سەلماندت عەشق درۆیە ..!
دەڕۆم تـا تۆ لە بیر بکەم
وەک چۆن منت لە دڵ دەرکرد
قەت ئەو رۆژەم لە یاد ناچێت
کە حاشات لە عەشقی من کرد ..!





ئەم سەفەرەم رەنگە دووری
نیشتیمانم بمگرێنێ
فرمێسکێک بۆ نیشتیمان بێ
گوڵ لەسەر گۆنام دەڕوێنێ
***

## شەرمەزاری

ئێستا بە تەنها ڕێ دەکەم لە تاریکی دادەنیشم
هێندە بێزاربووم لە ژیان شەڕ بە خۆشم دەفرۆشم
هەر ئەو دەمەی کە ڕۆیشتی ماڵئاوایت لێم نەکرد
وەکو یەکێ نەتناسیبێ ئاوا منت لە دڵ دەرکرد
چۆن شەرم یەخەت ناگرێ کاتێک هەواڵم دەپرسی
خوای ئەم عەشقەمان دەتگرێ پێمناڵێت بۆچی ناترسی ..؟
ڕۆژێک هەردێ باجی ئەو بەڵێنە بدەی کە شکاندت
بێ هیوابی وەک ئەو هیوایەی لە سینەمدا تۆ خنکاندت
***





## شەوانی مەینەت

ئەمشەو لە قەڵای ئەویندا
سێدارەم بۆ ڕۆح هەڵدەدا
لەسەر لێوی ماتو وشکم
چاوەڕوانیم کەپر و ساباتی هەڵدەدا
ئەمشەو بێ هیوایی باڵی بەسەرما کێشاوە
وەک دەستبەسەرکۆتی کردووم
خەمی دووریت هێندە سەخت و بە ئازارە
قوڕقوڕاگەی پەنجەرەکەی لێگرتووم
ئەمشەو چاوەڕوانی مەرگم منەت باربێ
بابێ و ڕۆحم بۆ خۆی بەرێ
پڕ بە دنیا هاوار دەکەم
تا کەی خەم بێ و ڕێم پێ بگرێ
***

## لە یاد ناچیٚ

گەر بمەویٚ ..
لە یادت بکەم دەبیٚ
وەرزەکان
لە ساڵ بتۆرێنم
پەپولە لە گوڵ و
گوڵ لە بەهار
بەهار لە جوانی
دابڕێنم ..!
دەبیٚ زەردەپەڕی
دوای تیشکی خۆر
بۆ هەتا هەتایی
بسڕمەوە ..!
هەرچی دڵۆپە شەونمی
بەیانیانە ..
لە ئەزەلدا بیگرمەوە





دەبیٚ گەڵاڕێزانی پاییزیش
بۆ وەرزی بەهار
بگوێزمەوە ..!
لە دەستم دێت
شەوی یەڵدا
لە هاویندا نویٚ بکەمەوە
بۆیە هەرگیز
ناتوانم
لە یادت بکەم
تا رۆح لە لاشەم دەردەچێت
هێندە ..
پەیوەستم پێتەوە
نیگاکانت هەرگیز
لە چاوما لاناچێت

***

## لێکجودابوون

**قەت نەکەی فرمێسک رۆکەی**

**ئەگەر هات و بیرت کردم**

**بە ویستی خۆت لێکجودابووین**

**وەک سەرەتا دڵت بردم ...**

**لە یاد بکە ئەو رۆژانەی**

**کە بەڵێنت تێدا دووپات دەکردەوە**

**من لە بیرکە وەک چۆن بیرت**

**لە دابڕان دەکردەوە**

***





## پەیوەست

**من ئاواتەخوازی مەرگم**

**گەر تۆ لە باوەشما نەژی**

**گەر بە ئاوی خۆشەویستی**

**باڵام نەبێ بە شۆڕەبی ...**

**بە وێنەی هەناسەی ژیان**

**تۆ پەیوەستی بە بوونمەوە**

**گەر تۆش نەبی بەو ئاواتەم**

**بکەومە دورگەی ون بوونەوە**

***

## بێ هیوا بوون

بەر لە ئێستام چی لە دڵما حوکمی دەکرد ...
بێجگە لە تۆ و لە عەشقی تۆ هیچی ترم شک نەدەبرد
تۆ نەک حاکمی ژینم و ئاوێتەی رۆح و گیانم بووی
تۆ ئەستێرە و مانگ و رۆژ و درووستکەری خەیاڵم بووی
تۆ چرای شەوگاری تار و خەوی قوڵی شەوانم بووی
تۆ گوڵی باخچەی هیوام و تەواوکەری جێژوانم بووی
موحیبەتی شاری دڵ بووی هەر تۆ گوڵ بووی
هەر تۆ خەون و ئاواتم بووی تۆ شادی و بەختەوەریم بووی
***





## کەی تەنیایی داگیرکەر بوو؟

دوور لە ئێستام رابردوومان پرشنگی خۆر بوو ...
شاری دڵم ئەوین لێزان هەر وەک زۆرزان پڕ لە سۆز بوو
کەی شەوانی گریان هەبوو بە دەم ئازار و ژانەوە؟
کەی تەنیایی داگیرکەر بوو بۆ سوپای دابڕانەوە؟
کەی بەری ئاسمان هەور بوو بە بارینی بارانەوە؟
چی رێیەک بوو پێیدا رۆشتین بەم حاڵەی شاد کردینەوە؟
کەی عەشق پیری موغان بوو بە ناو مەرگدا بتلێتەوە؟
چ شەوێک بەبێ یادی تۆ وەنەوزی خەو دەیبردمەوە؟
کام رۆژگارم بێ تۆیی بوو تا بیر لە تۆ نەکەمەوە؟
چۆن بەو هەموو جوانییەوە من تۆم لە بیر دەچێتەوە؟
بڕیار وابوو تا دوانەفەس بۆ یەک بژین
بڕیار وابوو تۆ گوڵ بیت و منیش پەرژین
***

## پێکێك لە خەم

پێکی خەم وا بە دەستمەوە هەرچەند دەیخۆم و کەم ناکا
رەنگە گریانی چاوم بێ بەردەوام فرمێسکی تێکــا
ئەو ساتانەی مەستم دەکا هەست و هۆشم لە لای تۆیە
هەست دەکەم تۆ بەختەوەری خەندەیەک بە لێوم دایە
لەو ساتەدا پێکی خەمم دەڕژێ بەسەر پەنجەکانما
ئیدی خەیاڵی روح بردووم دەتوێتەوە لە گریانما
ئیتر خەم چۆن ناخم نەخوا چۆن هاوڕێ نەبێ لەگەڵما
لە کاتێکدا بێ ئاگابیت لە ئەوینم کە هەمیشە وای لە دڵما

***





## عاشقی تۆم

گەر دەتەوێ عەشقت
وەک خوێن بە لاشەما بێت و بچێ
بمدوێنە هەتا رۆحم
بە پێکەنینەوە دەرچێ ...
گەر دەتەوێ لە سینەمدا
عەشقت لەگەڵ رۆحما دەرچێ
لێوت بێنە تا هەناسەم
بە ماچێکی تۆوە دەرچێ ...
من دڵنیام لە گۆڕیشدا
ناوی تۆ یەکەم پرسیارە
چونکە گوڵم لە چاوانما
تەنها روخساری تۆ دیارە ..

توخوا گیانە لە پاش مەرگم

پۆشاکی ڕەش لەبەر مەکە

یادگارییەکانی نێوانمان

لە دوای کۆچم بێناز مەکە

***





## تـــوانەوە

هەرکاتێ یادی تۆ دەکەم

بۆ ڕوناکی دەڕوانم

تۆ لە گشت ڕوناکییەکدا

ئاوێنەی بۆ چاوانم ...

ترپەی دڵم بۆ عەشقی تۆ

هەموو کاتێ کە لێ دەدا

لەبەر خاتری ئەو عەشقەیە

خوێن بە هەموو جەستەم دەدا

ئەگەر بێت و ئەوینی تۆ

بڕوا و لە ناو دڵما دەرچێ

نەترپەی دڵم دەبیستی و

نە خوێن بۆ خانەی لەش دەچێ

***

●●●

## پێڕست

ئاهی دڵێکی بریندار
ئاراس کاژاوی



•••